بزاف ٣٢

# پێکەکان
# بیریان دەچێت بمخۆنەوە

پێکەکان بیریان دەچێت بمخۆنەوە

**چنار نامق**

شعری... چنار نامق حەسەن
تایپ وپیت چنین: چنار نامیق حەسەن
بەرگ: هونەر مەرجان
نەخشەساز: شاخەوان جەعفەر
مونتیف: ڕێبوار ئەحمەد غولاّم
ژمارەی سپاردن: ٣٢٥
زنجیرە: ٣٢ لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی ڕۆشنبیرانی نوێخواز
پۆستی ئەلەکترۆنی نوسەر...
chnarnamq@yahoo.com

پێکەکان بیریان دەچێت بمخۆنەوە

## گۆرانیەکانی مەعشوقێکی ئەفسانەیی

ئێوارەیەک لە بێدەنگیدا خۆی دەخواتەوە و
شەویش زمانی لاڵ دەبێت
بە ئاوابونم لێڵ مەبە و
بەمەحزونیم ئاگر لەناخت بەر نەبێت
خۆریش دەمێ
چەتری هەوری بەسەردا دەن ئاوا دەبێ و
سینگی هەورێکی ڕەش بۆ خۆی شەقار دەکاو
لەوێ دەنوێ...
تاکو تۆ لەم خەوە ئەزەڵییە رادەکەمەوە
هەزاران جار وەنەوز پێلوەکانم دەباو
خورپەی ناخی سپیدە وەئاگام دێنێ
وەئاگام دێنێ ولەبێداریم مارە دەکات





ئیدی دەبمە دەزگیرانی ئەو و
لەزەمەن گومراتر دەروانمە ڕووی ساتەکان
لەباڵندەیەکی هەڵەتە نامۆتر
بەنێو قەفەسی شینی ئاسماندا گەشت دەکەم و
ئامێزی مەعشوقە خەمبارەکانم
بەبێدەنگی ونیگەرانی ساتەکان دەسپێرم
لەمەملەکەتێکەوە هاتوین
بێناونیشان لەجوگرافیای بووندا
تۆشەبەرەی خەونەکانمان پر لەسێوی رەنگاو
رەنگە
کەچی ئەسپی هیواکانمان
بەدوی لەتەسێوێکی گەنیودا غاردەدەن و
نیگاریشمان ئارەقەی نیگەرانی لێدەبارێت!!
بادەکان لەفوارەی خوێنم گەرم تر هەڵدەچن
شوشەکان هێدی تر لەخەیاڵم
دەشکێن ودەزرنگێنەوە
رۆحم لەشەوگار وەرەستر
لەگەڵ زاکیرەمدا دەدوێ
لەململانێی بوندا شەکەتی لێ دەرژێ
تۆ ئەی ئەووەی
هەمو تروسکە روناکیەکانی ئاسمان دەچنیتەوە

تاوانی نابیناییم مەخە ئەستۆی ئەو گوڵانەی
ئاوێتە بەروانینم بوون ..!
ئەو دەمانەی نازنازەکان بەشەرمەوە
نازیان بەسەر من وگوڵەکانی باخچەکەمدا
دەکرد
خۆشەویستیم وەکو هەنگ بوو
کە ژەهرە هەنگوینی ماچێکم
بەسەر لێوی ئاڵی
مەعشوقێکی ئەفسانەییمدا دەرژا
دواچرکەکانی تەمەنم لەحەسرەتا رادەوەستا و
مەرگ لەئامێزی دەگرتن
ئیدی رۆحم لەجەستەم و
گلێنەکانم لە چاوم وەرەس دەبوون .
وەرزێک زەمەن چوون روخسارم پەمەیی بوو
رۆژ وەک جەستەی گەرما بردووم
شەونمی خەمی لێ دەتکا
ساتیش وەکوناخم دوا ئاهی هەڵکێشا
لەگەڵ کاتژمێرێکی نیوە نوستودا دەدوا
زەمەن چی گەریدەیەکی شارەزا بوویت
پیاسەی گشت کۆڵانەکانی بەختەوەریت پێ
کردین و



لێ نەگەرایت
لەکوچەیەکدا نوچێ بدەین وخەندەیەک
لەنێودرزی لێوەقڵێش بردووەکانماندا رابکشێت
تۆی دەریاوانی زیرەک وئێمەی مەلەوانی نەفام
زیخەلانی سنگی هەموو دەریاکانت پێ پشکنین و
دەنکەیاقوتێکی ئاسودەییمان پێ نەبڕا
بیدەین لەبەرۆکی ساتە بێئۆقرەکانی تەمەن
سینگی گشت قەلەرەشەکانمان شەقار کرد
خۆرەتاوێک کوانوی دڵی گەرمی
بەروی کێڵگە ڕچیوەکانماندا دانەگیرساند و
پێت وتین:
لەم ماراسۆنی ژینەدا
هەنسک بۆ کۆترە پوکاوەکانی
سەر گوێسەبانەکان هەڵمەدەمە
ئەو دەمەی مانگ
ماچی رومەتی شەوی کرد
ڕەژوی رۆحم بۆخۆم و ئەو هاوڕێیانەم ،
کەماچمان لەبیر چووبووەوە
دەبوە پشکۆیەکی گەش !
پشکۆیەک بەنەرمە فوی با
دەبووە گرو دەکەوتە سەما ...

تۆ قەتماغەی برینەبەسوێکانم وێنەدەکێشی و
مەلەی گشت ئۆقیانوسە
وشکەڵاتووەکان
بەماسیە شەکەتەکانی نێوجەستەم دەکەیت و
پاشان دەپرسیت
بۆ مردن ؟؟





## لیمۆ بەهارییەکانی تەمەن

سپێدەیەک لەجریوەی ئەو چۆلەکانە وەخەبەر هات
فرینیان لەبیر کردبوو
نیوە شەوێک
ملوانکەکانی خەیاڵم لێک دەئاڵان
دەپسان وگرێ کوێرەم دەدانەوە
تنۆک تنۆک
گوڵەژانم دەخستەدەرروونی دەریایەکی
بێ ئۆقرەتر لەبینایی گوڵێکی سوری بەر هەتاو..
زەمەن بەهەشتەکانی تۆ
دۆزەخی دەرونمن
گەمەکانی خۆت وخەندەکانی من هاوتەریب مەکە!
شەوێک چاوم لەکن یاساوڵەکانی قەدەر بارمتە کرد

ئیدی نە لەباخچەکانی بەهاردا نوچێ دەدەم
نەلەزەماوەندی گوڵەکاندا سەرچۆپی دەگرم
نە بەرێکەوت نیگایەکم
دەڕوانێتە چاوی مەستی ئێوارەیەک
لەباڵکۆنەکانی سەفاوە
بەچارەنوسی مردووەکان پێمەکەنە
ئەو مردوانەی
بەشەقامەکانی بەر ماڵتاندا دەگوزەرن و
لەمیوەی باخچەکەتان ورد دەبنەوەو
پێت یاساغە چڵێ ئومێدیان تێگریت..
تۆ لەکوێرە ڕێیەکەوە دڵنەوایی بەیانییەک
دەکەیت
کاس بووە لەباسی هەقیقەت
نزای ڕۆژەکان بەترس ناو دەبەیت و
نوێژەکانیان بە تاڵ دەکەیتەوە
ژەنیارێک فوی کردە گەرووی نەی
خوری پەرچەممی بەبا کرد
زەمەن
شوێن پێی کاتژمێرە بێ چرکەکانی تۆکەوتم
ڕۆژ بەمانگ تێدەپەڕی
مانگ بە ساڵ و ساڵ بەسەدە





سەدەکانیش هەزارەیەکیان دەخایاند
عیشق لە سێبەرێک نوست و
ئێمەش لەزەمهەریری بیابانەکاندا،،
نینۆکەکانمان هەڵوەرین .
چ داستانێکت بۆ بگێڕمەوە؟
بیرەوەریەکی شەرمن
بەتەم ڕووی خۆی دادەپۆشی
شەوگار لەبێدەنگیدا ئاوس دەبوو
ژانی بەسپێدەوە دەگرت
گەنجێکی خەرەفاو
لە پەسا شەرابی ئەوینی دەڕشت و
شوشەکانی تور هەڵدەدا
مردن لە سای درەختێکی ئارامدا
زەماوەندی دەوێ..
دوێنێ زەردەواڵەیەکی گۆشتن
ماچی لێوی یەک بەیەکی
گوڵی باخچەکەمانی کرد
من وهەنگ وپەپولە پاسەوان بووین!
چەند ئەستەمە
شەرابی ئەم پێکەنینەش لەلێوەکانمان داچۆڕاو
پێڕا نەگەشتین چۆڕێکی بخۆینەوە

ئەم تەمەنەشم لەبارچوو
دڵۆپێک خوێن لەجەستەی بیمارم نەڕژا
خەونەکەم بەتاڵ کاتەوە ..
لای ئەو دەریا مانگرتووەوە تێپەڕ بووم
ماسیەکان ئاویلکەیان بوو
بڕیار بوو بەئەشکی هەور
خۆیان بشۆن
ئێوارەیەکی درەنگ وەخت ئەستێرەکان
عەبا رەشەکەی دایکمیان بە سەردادا
مانگیش بە فۆتە سپیەکەی
سەری خۆی داپۆشی
سیمای ئاسمان تادەهات ڕەش دادەگەڕا
تەنها سیمای هاورێکانم
گشت (بی) ڕەنگ بوون
چوون زەعفەران
تاڵ چوون بیرەوەری ڕۆژێکی شڵەژاو
عەیامێ دەپەنجەم درەختی زراف و
میوەی رەنگاڵەی گرتبوو
رۆژانە باخەوانێکی کووڕ
بەکامەی گۆچانەکەی میوەکانی دەرنی
ڕەشەبا یەک





بەهێمنی تەرزەکانی نەوی دەکرد
زستان کەسەرمایدەبوو
بۆ کوانوە ساردەکەی شالقێکی دەبری
ئێ ئیدی چ تۆوێ
برژێنم بەسنگی کێڵگەوە
تا لیمۆی روخسارم هەمیشە بە هاربێت

## سێبەرەکەم بەخۆم دەچێت

ساتەکان ئەودیوی مەنگیم دەشڵەقێنن
یۆتۆپیاکانی زەمەنیش
گەمە بەچارەنوسی بتە زیندووەکانی
نێو پەرستگای ئەوینم دەکەن
زەمەنێک تەڕی ڕوخسارم ڕادەموسێت
خەندەیەک لێوم دەکرۆژێ و
من بەرامبەر چاوەڕوانی ئێستێک دەکەم
بزەیەک بەئەشک
گەرداوی سیمام دەشواتەوە
گەروی کا تژمێرەکەشم گشت چرکەیەک
هەنسکێکی قوڵ هەڵدەداو ئەندێشەیەک
دەبیاتەوە و
پۆزش بۆحەسرەتباری ڕوخساری ڕۆژ دێنێتەوە



به سپێدەیەکی ڕەش داگەراو دەڵێم :
ئەو کۆترە ماتانە مەکوژە
کە پەنجەرەکانی ڕۆحیان کردووم بە گوێسەبانە و
بە سەر دیوارەکانی ناخمەوە هەڵنیشتوون و
چاوەڕوانن کات ئاوا بێت !
سێبەریشم بەخۆم دەچێت
لەڕۆشناییدا ون دەبێ و
تاریک دادێ پیاسە دەکات
ئەندێشەم دەمێ هەڵدەفڕێت
لەسەردواچڵی ئەستێرەیەک
باڵەکانی هەڵدەوەرێ
ئیدی جەستەی لەجەستەم جوێ دەبێتەوە ..!
کە سروەی شەماڵی نیگات
بەبیابانی هزرمدا دەگوزەرێت
دڵۆپێک لەخوێنی هەنار دەرژێتە سەر لێوەکانم
و
بەرگی درەختێکی تەڕ پۆش دەپۆشم و
ڕەنگی گوڵێکی هەمیشە بەهارم لێدەنیشێت
نیگایەکی پەرت بوو
پێناسەی دابڕانی بۆ لەتەکانی خۆی دەنوسی!!!
من و مانگ وسێبەرەکەم



هەر لەبانگی شێوانەوە نوێژی جوانیمان دادەبەست
وەلێ دەمێ سێبەری ڕۆژ
بەسەر دڵی خاکدا دەڕژا نیگاکانمان پەرت
دەبوون و،
ڕازەکانمان دەئاڵۆسکان
کە سات دەنوێ و تۆ چاوەکانت لێک دەنێیت
شەو لەغوربەتی خۆی تێناگا
چاوەکانم بەدورگەکاندا دەڕوانن
ئاسۆی ڕوانینیان وون دەبێ
ئاسمان و خاک دەس لەگەردنی یەک دەنێن
منیش نازانم چ باسە ..!!
لەڕەوتیشدا بە با ناچم
ئەو کەمێک لەمن خێراتر شەقاوەکانی دەهاوێ
دەرواو ئاورێک لەنیگەرانی دڵی من و
چاوی سات و
بێ ئۆقرەیی سەمای تەرزی
لاولاوەکان ناداتەوە .





## ڕۆمانسیەتی من وئــاگر

دەمێ سەدای پێکەنینت
ئاسمانیش سەرقاڵ دەکات
پێت وانەبێ
چۆک بەگومڕاییم دادەدەیت
لەدوو چاوی کۆترێکی نابیناوە دەڕوانمە،
گوێسەبانە تاریکەکانی ڕۆژگار و
لەودیویوە بەنهێنی تێڕوانینی
بێچوەکانی تۆمار دەکەم
متمانەم بەقەدەر نەکرد
ئەو دەمانەی
ڕووی تەڵخی ئاوێنەکانی

بۆ پەیکەری سەرابیم پاکژ کردەوە
بە دەسرێکی وەنەوشەیی
شەونمی سەر روخساری
گوڵێکی شەکەتی دەسری
شەو بەبۆنی ئەو گوڵانە
مەست نەدەبوو
کەهەناسەت دەیژاکاندن و
هەنگاوت بەسەردا دەنان
قەڵەمی دەستی (با) ی فڕاند
نهێنی دڵی دوێنێکە
بۆ سبەینێ بگێڕێتەوە
کە چرپەی هەناسەی ( با) دێت
نیگام چاوی بۆ دەگێڕێ .. و
ئەندێشەم گوێی بۆ هەڵدەخات
پەنجەکانم دەستی دەگرێت
نەبا وەک من نامۆ بێت و
لەم تەمەدا ڕێ هەڵەکات
نەرۆژ دەس لەخۆر هەڵدەگرێ
نە تاریکی دەس لەئەستێرە بەر دەدات
کەزاکیرەم بەبیرەوەری منداڵی
کاسە سەرم پڕدەکات





رادەمێنم
لەو هەنگەی گوڵێک ماچ دەکاو
هەنگوین لەلێوی دەچۆڕێ..
زەمەنێک
سۆزی دڵی نەرمی بەردێک
دایدەپۆشیم و
زەمەنێکی دی ..
خۆزگەکانم دەکردە چەپکێ وەنەوشە
بەدیاری دەمدان بەمردن
لە ئامێزیا سۆماکانم تاوێک بەهێمنی بنوێ
گشت دەروازەکانی بەهەشت
بۆ تێروانینم واڵا بوون
تێم نەڕوانین..
ئەستەم نەبوو
خۆ دەکرا لە دۆزەخیشدا
پەریەک دەستەکانم بگرێت .!!
ئای لەرۆمانسیەتی من وئاگر
ئەودەمانەی شین بۆ مردنی پەلکە گیایەک
دەگێڕین
سانایانە
بەخۆڵەمێش بوونی جەستەی خۆمان بیر

دەچێتەوە..
ئەو پێشکانەی خۆشیان دەوێم
شەوان ماچ لەلێوم دەدزن
بەزامەکانی سەرگۆنام پێدەکەنن و
دەڵێن وەرەسیت لێنایەت ..
تۆ دەرگا داخراوەکانی بونت واز کرد.. و
وەلێ خۆشت بویت بەتەم و
رووت کردە ماڵی تاریکی
هەنگاوێک پەی بەرێگات نابات
لەنهێنی بوون تێناگەم
ئەگەر ئاسن هەستی نییە
بۆ بەئاگر دەتوێتەوە؟
درەخت ئەگەر عاشق نەبێت
چۆن بەدەم شنەی با یەکەوە
سەما دەکات ..؟!





## چەمەریەکانی پێکەنین

دەمێکە یاسا چەوتەکان
جەستەم دەکەنە پەیکەری داروخاو و
لەئاتەشگای زەمەنێکدا
رەژوی رۆحم بە ( با) دەکەن
چرای چاوی سپێدەکان نوقمی تاریکایی دەکەن.
وەکو ئەشکی هەورێکی رەش
بەنێو پردی خەیاڵی پەرتبووماندا رۆدەچن
جامەکانی شەو بێداریان لێ دەرژا.
منداڵی لە خورافەی پیریدا
سەری کاس کردین ...
گەنجی هێند هەناسەی سەردو دوکەڵی سپی بەبا
کرد،
لەشەقامەکانی غوربەتدا شەکەت بوو

بەپێی چەپی خۆی کرد بەماڵی یەئسەوە !
دوا سرتەکانی تەمەن هۆشیان بەخشین بەگومان
لەوێدا لەخۆمان وون بووین...
تۆ دەنکە هەناری بیرەوەریەکانت
بەسەر سینیەکی قوپاودا ئەوڵی
دارتووە وشکەکانی بەختەوەریت رادەوەشاند
تۆوی رەیحانە رەشەت لەبیابانە بەژەکاندا دەچاند
و
لەوێرا چاوەروانی شکۆفەی نێرگزت دەکرد
بەکسپەی هەناسەیەکی پەنگ خواردووی ساردتر
لەزریان
ڕاهیبەکانت لەپردی سیراتەوە گل کردە خوار،
مەعبەدەکانی ئەوینی ساڵەهایانت دارماند،
پەنجەکانت لەکوشتنی بتێک بەر پرسیار نەبوو..
عەیامێ بوو
سەبەتەیەکی دڕاوت بەدەستەوە گرتبوو
بەدەم رێگاوە
هەڵوژەی نەگەییو و نارنجی کەسکت لێدەرژا
سۆفیانە لەخەڵوەتی ئەوینێکدا
بەزیکری دەروێشانەوە
لە دابەش کردنی نائاساى ئەم بوونە رادەمایت





بۆ ئاسمان شەو پرچی رەشە و
بەرۆژ سپی دەکاتەوە.. ؟
خەم کەدەگری بۆ چاوی سوور دەبێتەوە.. ؟
شادی بەچی پێدەکەنێ؟
ئەگەر لەشەرمی خۆر نەبێت
گوڵە نێرگز بۆ چاوەکانی دادەخات..؟
کاتێ لاشەی پێکەنین سارد دەبێتەوە
کێ چەمەری بۆ دەگێرێ ..؟
دەمێ هەتاو بوو بەکاروانچی سپێدە
نەوازشی بەسەر رۆژگاردا دەکرد
بەفر ئاسا
لەبەر تیشکی زیوینیدا تواینەوە
چون پۆرتریتی لاشەیەکی سەرمابردوو
لەمانگی چاوەکانماندا.. تێرامان.. و
لەناخماندا.. بێئۆقرەیی.. و
لەجەستەماندا.. شەکەت بوون
لەهەناوماندا.. وەرەسی خۆیی چێ ئەکرد .. !
زمان پەیقینی بیرچووەوە
لێوانمان حونجەی پیتەکان
دۆسیەی نزای ئەو باڵندانەم خوێندەوە
بوون بەقەقنەس

نەمدەزانی بێدادیان
بەدادگای داخراوی کام خوا بسپێرم
نەبا بەتۆمەتی جوانی مەحکومیان کات ..
لەپەنجەرەی ئەو هەورە سپییانەوە دێمەوە
نەورەسەکان دەرۆزەی بارانیان لێدەکرد
لەتەدارەکی ئەو مێرگە وەنەوشانەوە دێمەوە
تۆوی غرورێکی ئەبەدیان
لەکێڵگەی خەیاڵمدا چاند
ساتێک پێش هەرەسی ئەمەل
چاوەڕوان بووین
یاسەمەنەکانی خۆشبەختی چرۆ بکەن
گوڵی سوری رووی ئێوارەکان نەژاکێ
( با ) روخساری لێوەرگێڕاین !!!
بەرسیلەیەک خەونە مێوژیەکانی شەوێکی
بۆ خۆی دەگێڕایەوە
تەرزی لاولاوەکان چون پشتی مەولەوی چەمانەوە
دەمێ بەدیوارە وەهمیەکانی خەیاڵدا ..
هەڵدەزنان ..و
لەنهێنی ئەفسونەکان نەدەگەشتن ..
برژانگەکانی حەبیبە،
چون ژێی گیتارە شکاوەکەی دەستی زەمەن





لەچاوەڕوانی نالیدا پسان ..
لەدوا تخوبەکانی خەونی ئەو ئیمبراتۆرە دێمەوە
نیشتمان جگەرەی نێو پەنجەکانی بوو
لەگەرمەسێری تەمەنیا
گشت بەفرەکان تووانەوە
کلۆ بەفری بیرمان نەبێت
گشت شتەکان لەبەریانا سوجدەیان برد
چاومان نەبێت
پرچەکانمان بەرەوتی (با)
لەپایتەختە شوشەیەکانی فەنابووندا
لەنجەی دەکرد.. وەلێ
ئەستەم بوو تاڵێکی دەسکەنە کەن
رێکەوت دەمانباتەوە سەر ئەو شۆستانەی
چاوی زەمەنی خۆزگەکانیان کوێر کردین
لەسەمای ئەو درەختە پیرانەوە
فێری تازەترین بالیا دەبم
وەلێ ئێمەو ئەو وەرزانەی
جیا لەئاشنایەتی رۆژگار دەگوزەرێین
گۆرانیەکانمان تێکەڵ بوون
بەنەغمەی ئەو کەناریانەی لەکەرنەڤاڵی
مەرگیاندا

قەشەنگترین  سەما ساز دەکەن ..
سۆمای چاوە بێدارەکانمان
بەوهێشوە  فرمێسکەوە جوان بوو
لەچاوی مەنگی شەوێکی هەڵکوڕماوی
بەر شەستە بارانی قەدەر
دەڕژایە ناخی شەوێکی نوتەک تر لە بوون  و
سپێدە وەدەر نەدەکەوت
جیهانێکی نامۆ تری  لەغوربەتدا کرد  بەمەئوا
هاوەڵی  ئەو خەمانە  بووین
ئارامیان نەدەناسی  وبەدەم عیشقی بارانەوە
کۆتری سپی ئەوینیان لەئامێز دەگرت
بێئاگا  لەژانی روحی ئەو ساوایەی
شەوان بەدەم هەنسکەوە
لانکەکەی خۆی رادەژەنی
رۆژگار سەرابی  گەشتێکی بێکۆتایی
دینێتە سەر رێگامان  و
تاڵی  سپی پرچی  زەمەنێکی تورە
لەقامەتی  پەنجەکانمان دەئاڵێنێ .
کلاوکورەیەکی  کوژراو
نەفرەتی  لەو دێرۆکە کرد
بەخوێن  دیوار وشەقام  وساتە جوانەکانی ڕەنگ





کرد
هاوڕێکانم  تف لە تەرمی  خۆیان دەکەن
لەمەراسیمی  ناشتنی جەستەیاندا
بەمردن  پێدەکەنن
پێ بەسێبەری خۆم وئەو  خاکەدەنێم
سبەینێ گیانم  دەکاتە  مشتێ  گڵ  و
رۆحم بەسەر گۆرستانەکەدا هەڵدەفرێت  و
جارێ  زیندوویتی  خۆی دەدا
لەدووندی  ئەو  یاسایەوە دێمەوە
ژیان  شەرابێکە تاڵ تر  لەپێکەنین
مەحاڵە  گەر بینایییمان تێبپروانێ  و
ساتێک  هۆشمان ماندوو  نەکات
وەلێ رۆژانە دەیان جار ناخمان
بێویستی خۆی دەیخواتەوەو
لە تێڕامانی رۆحماندا شوێن ترپەی  پێی
ئەو پەڵەهەورە دەکەوین
تەرزی  درەختێکی  تازە هەڵچوو ..  و
کۆمەڵێ  گەڵای ژەنگ گرتوو .. و
ڕەوە مەلێکی  باڵشکاو
بە سەر گێڵگەی
بیابانێکی تینودا دەبارێنێ

## که مانگ دەنوێت
## ئەستێرەکان مەکوژێنەوە

بە شەوێکی ڕچیوم وت
گەر پێڵوی مانگ لە ئامێزتا نوچێکی دا
بە پێخەفی تاریکایی دایمەپۆشەو
ئەستێرەکان مەکوژێنەوە
که ڕۆیشتی بیرەوەریەکانم جێبێڵە
شەڕی ڕۆژگارم پێناکرێت
من و ڕۆژگار هەمیشە ئاشنای یەکین و
لەگەڵ یەکتردا هەڵناکەین
مەمکە ئاڵا و لەنشتمانی دڵتدا هەڵم مەکە
مەحاڵە بێ شنەی (با) بشنێمەوە
کێ لە نهێنی تورەیی دڵی ئەم نیوەڕۆیە





تێدەگا..؟
خۆ شەماڵیش ناتوانێ ئاشتی کاتەوە!!
زنەکانی چاوم شەونمیان لێ دەڕژا
کێ دەزانێت بۆچی شەونم
که دەڕژێتە سەر ڕوخساری
گوڵێکی مەست بەکوڵ دەگری ..؟
مەستم مەکە
نەبا مەستی فڕینم بیر بەرێتەوە ..
مەمکە ڕەنگ و مەمرێژە سەر ئەو کەڤاڵەی
هەمیشە کەسێک تێیناگات
دووی ئەو ڕەوە مەلەم مەخە
گوێ بۆ سەدای بێچوەکانی خۆیان ناگرن ..
مەبە خەم و
شوێن بێئۆقرەییم مەکەوە
ڕۆژمێرێکی دڕاوم
وا سەدەیەک خەریکە دەمنوسێتەوە
کاتژمێرێکی تۆز لێ نیشتووم
هەزارەیەک چرکەیەکم ناجوڵێنێت
مەبە ژان و بەشوێن زاکیرەم مەکەوە
زەمەنێکە
ڕێگای ماڵی خۆم و تۆو ئارامیم ون

**کردووە..!**
**مەبە شەونم و مەرزێرە سەر روخسارم**
**روبارێک گەروی وشکەڵاتووم تەر ناکات**
**ئیدی بەس لێم ورد بەوە**
**پەرتوکێکی دێرینم و**
**کێ لەم رۆژە مەستەدا دەمخوێنێتەوە ..؟**
**مەبە دەرزی سەر پەنجەکانت لەپێستم مەسوە**
**باکەلەسەرم شەق نەبێت**
**نەبا برژێم**
**کیشوەرێک کۆم نەکاتەوە**
**مەبە خەو و**
**پێلوەکانم قورس مەکە و**
**مەزێرە ناو چاوەکانم**
**نەبا گلێنەم بۆ چەند ساتێک کوێر بێت و**
**رەنگێک لەسۆمام وون بکات ..**
**مەبە بەپرد بەسەرتدا تێپەر نابم**
**بەتەرزی درەختە زراڤەکانی وەهمەوە خۆم**
**هەڵدەواسم**
**زەمەنێک هەنگاو بەسەر گەردیلەکاندا دەنێم و**
**لەگەڵ هەورا پیاسە دەکەم .**
**لەخێڵەکیەتیم مەپرسە**



**رەشماڵێکم ئەستەمە ببم بە وڵات**
**پێم وتی مەبە پەپولە.. و**
**بەسەر گوڵی لێوانمەوە مەنیشەوە**
**نەبا شیلەی ماچەکانم**
**باڵەکانت بڕاکێنن،**
**فرینت بیر بەرنەوە!**
**مەبە هەور وەکو دڵم سپی مەبە**
**نەبا تۆزی رۆژگار بێگەردیت داپۆشێت**
**رووم بەبێگەردی روخسارت هەڵدەخڵەتێ .. و**
**لە وێنای خەونە مەستەکانی بارانەوە وەئاگا دێم**
**مەبە باران دامەبارە**
**فرمێسکی چاوی مێژووم بەبیر دێتەوە**
**کەشارم شەلاڵی خەم بوو**
**لەپرسەی مەرگی گوڵەکان!**
**دیسانەوە دامەبارە**
**ئەستەمە لەم بیابانەدا چڵە گیایەک شین بێت**
**..**
**لەچاوەکانی رۆژگار راماو تر لێم مەروانە**
**شوێن هەنگاوی با مەکەوە**
**جەستەمە لەتاریکی مەسوە**
**نەبا شەوگار چاوەکانی هەڵبێنێت وەئاگا بێت**

گەر رەنگیشم لەتاریکیدا وون ببێت
هەناسەم دەناسێتەوە
باوەر بە ترپەی پێی باران ناکەم
لەوەرزی ئەم رچینەدا
لەنهێنی وەرەسی ناخم مەپرسە
ئێ خۆ ناکرێت
وەڵامی گشت پرسیارەکان
لەدڵی من و شەودابێت





# لێوارەکانی وەڕەس بوون

ئێواران شۆستەکانی ئەم شەقامە
بێ ڕیتم دەهاتنە سەما
کات بەبۆنی پرچی سنەوبەرەکان
مەست دەبوو
بەپەڕەی گوڵ سیمای ئاواتی ئاڵ دەکرد ..
پەنجەکانم تەوقەی پەرچەمی شەوێک بوون
مانگ بەخودکارێکی سور
چارەنووسی دەنەخشاندن ..
تۆ دووی سێبەری هەتاوێک کەوتبووی
ئاوری لێدەدایتەوە و ناوچەوانی گرژ دەکرد..
ئەوەندە لەدەستی قرتاوی ژان دەترسای
بەرۆژ دەهاتە خەونت و
شەوان فتوای حەڵاڵ بونی مەرگی دەدای ..

بەیانیەک کوچەکانی ئەم شەقامە
پڕبوون لەبونەوەری جۆراو جۆر
هێڵەکانی دەکشاو دەکشا..
شەمەندەفەرێکی سپی بەپێی نازی
چارەنوسی گوڵە سورە زەرد هەڵگەراوەکانی
دەشێلا
کەترس رەنگی بردبوون
شەو لەتاریکیدا گریا و
مانگ لەتاراسپییەکەی سەری وەڕەس بوو
رۆژ بەتیشکی گەرمی، جەستەی سپی خۆیی
دەسوتاند و
بەڕەژوی ئەو سووتانە
سیمای  ئاسمانی رەش دەکرد
چەم لەبێئۆقرەیی ئاو ڕابووەوە
کانیلەیەک لەتینوا گەروی وشک بوو
لەئەلبوومی یادەوەریەکانم رادەمام
وێنەی خۆم وهاورێکانم نەدەناسیەوە ..
تۆ  سەر  بەهەرێمێک بوویت
ناویت نەدەزانی
وانەکانی قوتابخانەت بیر چوبووەوە
پیتێکی بارانت بۆ  حونجە  نەدەکرا





کات لەسورانەوەی خۆیدا ..و
کاتژمێر لەخولانەوەدا  وەڕەس دەبوو
گەلای  سەوزی درەختەکان .
بەچاو تروکاندنی رەشەبایەک
بە گڕی یەکتردا دەچوون ..
بایەقوشێک  تەمەنی باڵندەکانی دەنوسی
کۆترێک بێچووەکانی لەئامێز دەگرت
من وتۆ و زەمەن وعیشق و شەقامەکان
لەگەڵ  بیرەوەریەکانماندا ناتەبابووین
زستانان بەرگی هاوینەمان دەپۆشی..و
هاوین لەرز  دایدەگرتین
بەهار چاوەکانمان دەنوست
تەنها خەزانمان خۆش دەویست
وەلێ  ئەویش
نیگاکانمانی هەڵوەراند ..
کوێ  بۆ نیگا رژاوەکانم بگەرێم ؟؟

## گەمەکانی من و بیکاتشۆ

بەشی یەکەم
زەردەپەرە وئەندێشەم
لەهاتوچۆدا هەنگاو دەبیا .. و
بەلای جەستەی کەنەفتی خۆرەتاودا تێدەپەڕێ و
لەسێبەری چنارێکدا دێت و دەچێ..،
لەنێو پیاسەی شێتی ئەودا
نیگەرانی دەمخواتەوە و
یادگارە تاڵ و شیرنەکانم
دەمێک سوێر و دەمێکی دی مزر دەبن
لەم بونەدا جوگرافیایەک نییە
خەونی سانایی رۆژگاری تیا نیشتەجێ بێت
ئاسمانێ لەخۆی نابورێ





بێچووە مەلێک فێرە فرین کات ..
ئەستێرەیەک رازی نییە ..،
شەوێک خۆر لە ژوانی بنوێت
دەریاچەیەک پێی ئەستەمە بۆ چەند ساتێک
ئاو ئیزن دا.. و
دڵی بیابان لەکۆش بگرێت
وەرزێک نییە بەرگی وەرزێکی دی بپۆشێت .
ئاە.. بیکاتشۆ تەنها من وتۆین
بەرگەکانمان یەک رەنگن و
خەونەکانمان بەیەک دەچن
رەنگە چارەنوسیشمان هەر بەیەک خامەو
یەک رەنگ نوسرابێت
دەشێت سەفەرمان دوور ونزیک بێت
خەونم دیوەو چاوم دەفرێت
خوایە بەخێری بگێریت
کات وەکو بیکاتشۆ دەروات
خۆشەویستیش لەگەڵ
لاشەی ئەودا دەنێژرێت
لەودیوی چرپەی دەنگەوە
وشەکانم باڵ دەکەم
دەنگی خۆم وجریوەی چۆلەکەکانی ناخی

کەون
دادەمرکێنم
منیش وەکو بیکاتشۆ ژیانم خۆش دەوێت
وەلێ رۆژگار لێم ناگەرێت
چاو ببرمە دورگەی دووری چاوەکانی .. و
نیگا قووڵەکانی بدزم
لەروخساری ورد ببمەوە و
دەستەکانی لەنێو دەست نێم
بەناخیدا شۆرببمەوە .. و
بەنێو خەیاڵیا رۆ بچم..
ژیان کەچاوم تێدەبرێ
چاوی پرە لەئەستێرەی بێ روناکی و
دڵی لێوە لەخۆشەویستی بێهەست ،
لێیدەرژێت و من لێی ناگەم
ناخی پرە لەپرسیاری بێ بەرسڤ .. و
چاوەروانە بەرسڤێکی بدەمەوە
وەلێ منیش ئێزابێل ئاسا
خۆم لەوڵامی پرسیارەکانی دەدزمەوە و
پێی دەڵێم: ئەمن بیکاتشۆ ناناسم
تەنها لە خەونێکدا بینیم
وەلێ یەکەم پاڵەوانە لەدەسپێکی چیرۆکێکدا





دەمرێت!
بەشی دووەم
ئەمە بە عەشق دەچێت وعەشق نیە
بەخۆشەویستی دەچێت ویەکەمین پیتی پساوە
تۆ دەنویت ومن لەشەستە بارانی نیگا
ساردەکانتدا
هەڵدەکورمێم.
نەچەترێکم لەئەویندا بۆ هەڵدەدەیت
نەعەشق دەکەیتە پێخەف و دامدەپۆشیت
ئاه بیکاتشۆ
خەونەکانم پچڕ پچڕن و وبێکۆتایی
لەخەونمدا تۆ دنیایت.. و
من پەڵە هەورێکی سپی
وەشتە بارانی بەهارم بەسەر دڵتا داباراند و
هەر تێر نەبوویت
شەستە بارانی خۆشەویستیم بەسەر ناختا
داباراند..و
وتت با بێت
پەموە بەفری موحیبەتم
بەپەنجەرەی رۆحتدا دا و
پێت نەزانیم

ئەوەی هەست و نەست و سۆزە
لەتەک گۆشت وخوێنی خۆمدا
بەتۆم بەخشی وتت کوانێ
ئیدی تۆش لێم زویر مەبە
گەر کرنۆشم کۆتایی هات و
پێم وتی :
ناتوانم خۆشم بوێی
فرمێسکەکانم دواییان هات
ئیدی فرمێسکی چاوی تۆم پێنابینرێ
لەم سەفەرە
گلێنەکانم چاوانیان بەجێ هێشتم
پیتێک نەما یاو شەیەک بەتۆی بڵێم
بیکاتشو لەخوێنم دایە و چرنۆک لەزاکیرەم
دەگرێت ..
وەلێ هێندە شەرانگێزە
لێ ناگەڕێ
جۆرێ نیگا لەچاوانی بخۆمەوە
هەر شەوێک لەخەوندا دەیبینم
دەڵێم خێر بێ و سام دەمگرێت
بیکاتشۆ بریارم دابوو
هەتا گیانم لەبەردایە خۆشم بوێی





ئەوینم هەڵچونێک نەبوو لەپر داچێت
باڵندەکانی جەستەمت بەتۆراوی سەرگەردان
کرد
ئیدی مەلێ کوێوە دەفرێ
بیکاتشۆ دەزانم بێ تۆ بەڕیان دەوترێ مەحاڵ
کەچی رۆژگار گشت چرکەیەک
قۆرتێک لەدڵما دەکێڵێ.. و
عاگوڵی تێدا دەچێنێ
ئاه بیکاتشۆ
ئەم باسە کۆتایی نایە و
بەخوێنی دڵ دەینوسمەوە
دەڵێن لەگەڵ ئاهەکانما بەدرێژایی ساڵ
بەملیارەها فریشتە جەستە بەدۆزەخ دەسپێرن،، و
من بێئاگام
تەنها بۆی رەژووی رۆح و
هەڵقرچانی جەستەی خۆمم بەلوتدا دێت
لە دڵرەقی تۆدا دەسوتێن
ئایەتەکانی عەشقم سووتان
دانەمرکایت
کەلە سەرم پوکایەوە
ئارامیت نەکرد بەسابات

تەمەنت  ئەنفال  کردم   و
هۆشم پەی بەرێگام   نابات
دەسا فەرموو کوێوە بچم
تۆم بیر دەچێت
من نازانم ئەو ساتانەم خۆشدەوێت
کە لە شعورما سەوز دەبیت
یا لەئیدراکم وون دەبیت
نا ئەم خەراباتی   عیشقەم
لەدەستی زەمەنەوە دوورە..
نابینا بووم
ئەودەمانەی جەستەی  خۆمم  دەکرد
بەرەژووی دڵ
زاکیرەشم لەرێی عیشقی
نابەجێی تۆدا پوکاندەوە
تۆش   هەموو دەم
لەئاشتی و تورە بووننتدا
پێت  بەزەخمی دڵما دەنا و دەتگووت
میاو میاو .. میاو
-توخوا کتە..  کت بەسیەتی
هەڵمەزنێ بەو گوێسەبانە بەرزانە
بێچوەکان  زاڵە  تەرەک مەکە





با  لەژین  بێوەری نەبن
وەرزێکی دی  لەتەمەنمدا  تێپەری.. وپێم  نەزانی
جەستەی تەڕی درەختەکانم
لەنێو ئەم  وشکەساڵەدا زەرد هەڵگەرا   و
هیچ  بە  (  با  )ی  خەیاڵتا نەهات
شەپۆلەکان  لەتینواندا
سەریان  بەتاوێرە  بەردی قەدەردا دەکێشا ..
تنۆکێ  ئاوی  میهرەبانیت  نەدانێ  .
دەشێت  تاقە  دارستان  نەبم
کە لەخەونی  شوومی  باخچەدا  دەسوتێ
یا  یەکەم  گوڵەهەنار نەبم
بەناکامی  هەڵدەوەرێت
یاخود یەکەم مرۆ نەبم لەسێبەری  خۆی  دادەبرێت
رەنگە وەک ئەو گوڵەش  نەبم  پێش هاتنی
وەرزی  بەهار
بە دەست رێبواری سەر رێگاوە  هەڵدەوەرێ
وەلێ  چیرۆکی من و تۆ  لەگشت  ئەمانە سەخت
ترە  و
کەس  تێناگا
لەبێدەنگیم نوقم  مەکە
هاوارەکانت دێنە گوێم

ڕۆژ  بە دەوری من  وخۆیدا دەخولێتەوە و
تۆ  وەک خۆتی ،نەچاوی عیشقم  ماچ  دەکەیت
نەتاوێکیش خۆشەویستیم  رادەموسیت
بیکاتشۆ کە هۆشم  دەبات  ئیدی  نازانم  چی
دەڵێم
ئیزرائیل  هێندە  بەمەکرە
لەکاتی  گیان کێشانمدا  سیمای  خۆییم  پیشان
نادات
دەمێ  داوایی  روحم  دەکات  سەر تاپا بەرگی  تۆ
دەپۆشێت
لەمەبەستی وی  تێناگەم ..!
ئەو دەیەوێت روخساری  تۆ
لە نێو نیگای روحی فرپومدا  تەڵخ  بکات
یا دەیەوێت  سیمای خۆیم  لەبەرچاودا  نەشێوێنی
منێک لەودیوی  خۆمەوە
تەمادارە پەیامێکم
بەگوێچکەدا  بچرپێنێ ..
چیم بەگوێدا دەچرپێنی
بیکاتشۆ  هەردەم دەیەوێت
ڕەوتی ژینم پێبگۆڕێت
شیلەی نەمامی حەزەکانم هەڵمژێت  و





دوا  پێکی شەرابی ئەوینم هەڵقورێنی
گشت کاسەکانی ژیانی داچۆراند و بردی
گشت بەهەشتەکانی  بەناوی خۆیەوە نوسی
تا  لەو دنیاش باخچەیەک  بۆ ئێمە  نییە ..
ڕۆژی  لێگۆرین  بە شەو و
شەوی کردین بەپێدەشتی بێ ئەستێرە
منی نوقمی  ئەندێشە کرد
تاقە گوڵێکی  لەگوڵزاری  بیرەوەریمدا نەهێڵا
منیش بە ئەسپایی  پێم ووت:
تۆ بەمەزنی خۆتەوە..
زۆر ئەستەمە لەدڵما جێگات  بێتەوە..
بیکاتشۆیەکم دەناسی  هیچ  پەیمانێکم نەدابویە و
پێی دەوتم: بەهەشت لەژێر پێی تۆدایە!!
فریشتەکان  لەپەنجەرەی ئاسمانەوە
گوڵاوبارانیان دەکردم
لەبۆنی عەتریان  لەخۆ دەچووم
لەمەستیما بەکوڵ خەیاڵم  دەگریا
منێک  لەودیوی منەوە تێم دەڕوانێ  و
خەمێک لەودیوی منەوە   باڵا دەکا
تەرزەکانی بەسەرما  شۆر دەبێتەوە  و
گەڵاکانی  دامدەپۆشێ   و

لەسیمای ڕەش داگەڕاوم رادەمێنێ
سەیرە زمانیشی نییە
کەچی بەچرپەوە دەڵێت:
تاکو دوێنێکەش قەزەم بووم !!
نا بیکاتشۆ گەر دەست نێمە نێو دەستی تۆ
مێژو قسەم لەتەک ناکاو
شیعریش ورتەیەک بەگوێمدا ناچرپێنێ
هاورێکانم لێ دەتۆرێن و
(نالی)م پێ ژیرنابێتەوە ..!!
شەوێک لەخەوما بیکاتشو
وەک پشیلەیەکی نەوسن ..
دانی لەرۆحم وەردەدا وخوێنی دڵم
بەلێویدا دادەچۆرا
هاوارم کرد زارم بەسراو
کەس نەهات بەهانامەوە
شەوێکی دی لەخەونمدا ..
هاتبوو گیانم بکێشێ ..
بەخەندەوە پێم وت:
فەرموو بزانە
گیان کێشان بەدەستی تۆ چەند ئاسانە
بیکاتشۆ لەپاش جەنگێکی دووسەدەیی





توانی نەست وهەستم دیل کا
بچێتە ناو کەلە سەرم وفەرمان بەکردارم بدا ..
سەیرەهەموو جەنگەکانی جیهانم بردەوە..و
ئەم جەنگەی بیکاتشۆم دۆڕاند
کەچرپەیەک دەنگت بەبیستنمدا دەهێنێت
رۆژەو دە جاران خەم
ماکیاژی لێوەکانم دەخواتەوە ..
ئیدی نازانم (با) لەکوێوە هەڵدەکات و
چی وەرزێک باران دەبارێت
تۆ لەگەڵ هەموو ئاوازێکدا سەما دەکەیت و
بەو نوکتانە پێدەکەنیت کەوا ختوکەی من
نادەن!!!
سەردەمێک دەزگیرانی باخچەیەک بووم
گەڵاکان بەشکۆوە تەماشایان دەکردم و
درەختەکان بەحورمەتەوە تێیان دەڕوانیم
لەپەنای ئەنگوستە شەوێکدا دەنوستم
بەئەمانەتەوە زەمی بەیانیمان دەکرد
ژیان لەزەینی مندا لەزەتی ماچێک نییە
لەلێوی تەری ئێوارەیەکی درەنگ وەختی بدزم
تریقەی پێکەنینێک نییە
ساتە وەختێک لەبێهودەییم قوتار کات

بڵێم ئیدی پێویستم بەفرمێسک نییە ..
کۆترە سپییەکان هەڵفرین
گەڵاکان بەدوایاندا کەوتن
نەفرەتم کرد لەو سێبەرەی جەستەمی کرد
بەتارمایی ..
پاش دۆراندنی ئەم جەنگە نەمزانی ڕو لەکوێ
بکەم
چەند موسافیرێکی سەیر بووین
سۆز لەهەناوماندا دەڕژا وکیشوەرەکانی ئەوینمان
بەجێدەهێشت
سەیرکە چەن نامۆم بەم بوونە !!
مردووەکانیش گۆڕەکانیان جێ هێڵاو کەوتنە سەما
تۆ گۆرانیت بۆ دەوتن
تەنیا من نەبێ لەو گۆڕەپانە سامناکەدا
ریتمێکم نەبوو بۆ ژیان تا نۆتەیەک بۆخەمەکانم
دابنێم
سەمابکەن
تۆ ئاوێتەی جەستەی رزیوی ئەوان بویت
بەروخساری شێواوەوە
گشتتان دەهاتن من بخۆن ..!





## خەونە خێڵەکیەکانی بیابان نشینێ

باران تاو تاو
سەری ئەو درەختانە دەشوات
بۆ مەراسیمی ناشتنی رۆژگارەکان ڕێدەکەون
نەنکم بەپەنجە چرچەکانی
تەمەنی خۆی دەرێسا
لۆچی رۆمەتەکانی دەخوێندەوە
دەفتەری سپی پرچەکانی دەپشکنی
تەنها ئەم دەستەواژەی تێدابوو
(رێسەکەم مەکەنە خوری )
من ولەتە مانگێکی رەش پۆش

کەهاتینە ئەم هەوارە پر تەلیسمە
دوو شاژنی شوشەیی بووین
زامی قەتماغە نەبەستوی سەدەکان
بە روخساری تەڵاییمانەوە نوسا و
پەرچەمی خەونەکانیشمان
لەئاسمانە کریستاڵیەکاندا
دەشنانەوە ..
دوێ شەو لەروناکی ئەستێرەیەکی کز تر لەبیناییم
لەغیابی چراکاندا
دیرۆکێکم دەنوسیەوە
درکاندنی یاساغتر بوولە پەی بردن بە ڕچە ڕێی
حەقیقەتەکان
بێدار تر لە چاوانی شەو
لەسوڕانی دواین چرکەی کاتژمێرەکان چاوتێدەبڕم
..و
زەمەن دەوەستێ
پێڕاناگەم خەونە خێڵەکیەکانی شەو
بکەم بەدەوار نشینی بیابانێکی بێئۆقرە
پێراناگەم شەونمی سەر روخساری ئەو ساتانە
بسرمەوە
پەشیمانی دواین وێستگەی بێهودەییانە





لەکەرنەڤاڵی ئەم ئێوارە مەرگەدا
دواین کوچە و
دواشەقامی خەونەکانم دەپشکنم
دەمێ دەبمە حوکمڕانی ئەفسانەیی شاری ئەوین
دەمێکی دی عەرشی عیشقم خاپوور دەکرێ..



## راچەنینی ساتەکان

ئەوشەوانەی
گڵۆپە کوژاوەکانی سەر شەقامەکانی گێتیم
دەژمارد
(با) فوی لەچراکان دەکرد
زەمەنێک وەکو من
جیا لەوان دەئاخافت
گەردیلەیەک بووم لەو ساتانە بەجێ مام
دوائین وییستگەیان نەبوبۆ چاوەروانی
ئای لەتێرامانی
چاوی بێئۆقرەی کەناریەک
دەمێ لەدورگە سامناکەکانی
خەونەکانیدا هەڵدەفری ..و
لەقولایی چاوی کوندە بەبۆکان رادەما





ئەو دەمانە
مانگ لەچاوی کچێکی ماتی رەشپۆش نامۆتر
دەیروانیە چاوی گەشی ئەستێرەکان ..
ئاقارێکی چۆڵ
بارتەقای کەون پێکەنینی
رژاوی تێدا جێمابوو
دەستەکانم هێشویەکیان نەچنیەوە
دەبوو ئەوان لەو ماسیە نوستوانە نەخۆن
کەوا قەدەر رێی پێ نەدان
بەکراسە سەدەفێکانیانەوە
لەگەڵ ئاوازە خەمبارەکانی ئەو شەوەدا سەما بکەن
نیوە شەوێک
زەنگێک لێیداو هێڵەکە پسایەوە
دەیان خەون و سەدان پرسیاری
لەناخمدا بەجێهێشت
شەوگار چون بیناییەکانم زەق دەیروانی
لەخەونمدا پرچم درێژ دەبێتەوەو
تاڵەکانی
یەکە یەکەی شەقامەکانی شار دەماڵێت
دایە گەورەم لەگۆرەکەی وەرس دەبێ و
دێت لەماڵەکەی ئێمەدا

گۆرێکی دی
بۆ خۆی و باوکم چێدەکات ..
پشیلە رەشە بریقە دارەکان
بەپەنجەرە داخراوەکانی ژورەکەدا هەڵدەزنان و
لەسەر رایەخەکانماندا
تەرمی بێچووەکانی خۆیان دەخوارد
زەنگێک لێدا و
دەیان خەون و سەد پرسیاری
لەزاکیرەمدا بەجێهێشت
هەر ئەو شەوە لەخەونمدا
لەنێو تاریکی ئاسماندا خۆر هەڵات.. و
چەند ساتێک بەرلەوەی خەڵکی وەئاگابێت
رەشی پۆشی و لەچاو وون بوو
پانتاییەکان
چوون دڵی من لێوان بوو
لەتەرمی زیندوو
هیوای نێژراو
رستە خەمێکم بەدیوارەکانی هەتاودا هەڵخستبوو
تاچاو برکا درێژەی برد
وەکو شەقام
وەکو رێگاکانی سەفەر ..بێکۆتایی





ناتەبایی من وزەمەن لەو جەنگەوە سەری
هەڵدا
لەشکستیدا کفنی مردووەکانی شەرگەی کرد بە
ئاڵا
کەڵەبابێک .. زەنگی سپێدەی لێدەدا رادەچەنیم
..
نەمدەزانی کام چارەنوس بەپەنجە درشتەکانی
تارای سپی سەری شەو هەڵدەداتەوە
ساتێ دێ تۆش ئۆغر دەکەیت
وەکو سەفەری کاتەکان
کەس ناڵێ ئۆغرت خێر بێت
زەمەن لەنیگەرانی دڵی ساتەکان
بێ ئاگا دەگوزەرا
لە پەیقینی ئێوارەیەکی مەلول ناحاڵێ
شەقامەکانی دەپێواو
بەدەستارێکی روشاو
خۆزگەی دڵی
رۆژگارەکانی دەهاڕی

# وەرزێک باخچەکەمان داناپۆشێت

کەهێشوە ترێی زەردەخەنەم
وەرس دەبوو
دیوارەکانی رۆژگاری
دەکرد بەپەڵە..
نە رەزێکی وشکەڵاتوو
لەکینەی ئاگر دەگەیشت
نە چرایەک
لەسیمای رەشی شەو
سەری دەردەهێنا .
شەمشەمە کوێرەیەک دەیوت:
شەوان کە گێتی کوێر دەبێت
تێڕوانینم تەڵخ دەکات
ماسیەک لەبێگەردی روخساری ئاو رادەماو





قسەیەکی بۆ نەدەکرا ..
ئەو دەمانە کڵۆیەک بەفری سپی بووم
بەگژی پشکۆدا دەچووم
پاش چەند ساتێک
گەردیلەکانی جەستەم
لەئاسمانێکی تەماویدا
بەسەر دڵی بیابانێکی لێو قڵیشاودا
دەباراند ..
خۆ بیابانیش چوون دڵم
کۆڵوانەیەکی پڕ خەمی لەکۆڵدا بوو
خەیاڵاتێک نەهات دڵنەوایی بکات
بستێک لەخوار ئاپارتمانەکانی سەفاوە
ئەستێرەیەکی مانگرتوو مرد
پێکەنینێک بۆی نەگریا،
هاورێکانی فاتیحەیەکیان بۆ نەخوێند
باخچەکەمان ڕووتبووەوە
وەرزێک بەسۆز داینەپۆشی..
سەیرە پەنجەی درەختەکان
لەگەڵ ئەم زریانە شێتەدا
چۆن هەڵدەکا
ئاو کۆچی کرد

کەنار نەیووت بۆ کوێ دەچیت
سپێدەیەکی نیگەران
باسی عوزلەتی خۆی دەکرد
ئێوارەیەکی لەخۆ بایی
قایل نەبوو
چرکەیەک گوێی بۆ شل بکات ..
باسی ئەو عوزلەتە ناکەم مارکیز دەیڵێت
من تەنهاییەک دەناسم
بێدەنگی دەدوێنێت و
چرپەی هەناسەشی نایەت
هەنگاو دەنێت
شوێن پێیەکانی دەسڕێتەوەو
کەسیش پەی بەماڵیان نابات
کەپرچی (با) سەمای دەکرد
کاتژمێرێک لێدانی دڵی ئەوی بۆ نەدەژمێردرا ..
دوێنێ خەیاڵ
پەلکێشی ژورێکی کردم
لەتەنهایی چەند ئەستەمە
ئەو دەمانە تۆشم هەبوویت
کەمانگ وخۆر
تاقانەی ئەم ئاسمانە بن





ئیتر بۆ نەوازش نەکەن
بەسەر گشت هەسارەکاندا و
ئیدی بۆ دەبێ لەمن گومرا تر نەبن
جیاوازی من وتۆ و باران لەوەدایە
تۆ فرمێسک لە چاوەکانتا
قەتیس دەکەی
ئەو لەناو دڵی هەورێکدا ڕایدەگرێ
من کراسی زەردەخەنەی لەبەر دەکەم
هەندێ جاریش
لەگەڵ ئاوازێکی خەمناکدا
دەیکەم بەگۆرانی

## پێکەکان
## بیریان دەچێت بمخۆنەوە

بەچرپەیەک دێیتەوە دنیای دڵم و
تەرمی ساڵەکان بەگۆرستانەکانی
مێژوو دەسپێریت
ئاسمانی چاوی نابینام
لێو دەکەیت لەمۆمی داگیرساو
هەموو ساڵێک گەلایەک
لەو درەختە رەنگاڵەیە دەکەیتەوە و
بۆ مەرگی ساڵێک
تنۆکێ رۆندک نارێژی
ئیدی چۆن داوام لێدەکەیت
بڵێم گشت ساڵێک بەخۆشی ..!!
کەتۆ هاتی
نەشەو مەیلی خەوی مابوو





نەرۆژ چاوی هەڵدەهات سەیری ئاسۆ کات
کەسێبەرت بەلای شەوگاردا تێپەری
نیگەرانی ڕوخساری ڕۆژی داپۆشی
ئیدی بازێک بەسەر شانما نەنیشتەوە و
ئەستێرەکانی سەر پەنجەم کوژانەوە
و
شیعرەکانم لەتاریکیدا دەنوسی
سپێدەیەک بەجریوە
خەیاڵم پرکە لە خۆشی
لەجێی خەمدا با بەخەندەیەک ئاوس بم
ئەوکات بەڵێنت پێ دەدەم
دانەکانم نەشارمەوە
ساڵ رۆیشت و
باڵندەیەک شوێن کۆچ و کۆچباری نەکەوت
شەو نییە کابوسە خەونێک
وەئاگام نەهێنێ
بەچرپەیەک دێیتەوە دنیای دڵم و
خورپەی ناخم دەهەژێنی
دەستەکانم پر دەکەیتەوە لەگوڵ و
چاوەکانم پرئەستێرەی گەشی هیوا.. و
ناخم پر کۆتری سپی خۆشەویستی..

نا هاورێ چیدی بەجوانی
ئێوارەیەكی نارنجی سوێندم مەدە
نەبا لەغروری خۆمدا
رازی دڵی
چڵە نێرگزێكی ژاكاوم بیرچێتەوە ..
گوڵەكان كەدەژاكێن نامرن،
لەخەیاڵی مەستی مندا
هە میشە یاد دەكرێنەوە
سپێدەیان بەكام شەقام بڵێم دەخیل
لێرەوە دێت چاوت لێی بێ
بەكام خۆرە بڵێم هەورێك
لەژێر سنگتدا رابخە نسێ بكات
نەبا سیمای رەش داگەرێت..
یابەكام شنە با بڵێم
دەمێ دێت خۆت بشارەوە
نەبا لەنجەت ئاوێتە بەرەوتی ببێ و
نەیناسمەوە
سەر پەنجەكانت پڕ كردم لەئەستێرە
وەلێ
دورگەی چاوەكانم
ئاسمانێكی بێ ساماڵە





كاتژمێر دوانزە دەژمێرێ
چركەكانیش لەحەژمەتا
دڵیان پەلە پەل لێدەدات
كات دەوەستێ و
پێكەكان لەبیریان دەچێت بمخۆنەوە
لەپرسەی مەرگی ئەم ساڵدا
منیش وەكوچركەكان دەخولێمەوە و
پێم ئەستەمەبڵێم :
گشت ساڵێك بەخۆشی

## تابلۆکانی من و زەمەن لەهیچدا یەک ناگرنەوە

کەرۆژ  پێڵوی چاوەکانی
بۆ دوا سەمای ماڵئاوایی پەلکە زێرینە دەگێرا
چەند مەملەکەتێکی جیا جیا بوین
سارایەک بوین بەژو تاریک
بەتونێلەکانی فەنا بووندا دەگەڕاین  و
دژایەتی
مانگ و خۆر و ئەستێرە و
بارانمان دەکرد
ئەستەم و سەیرە
بونە وەرە  بچکۆلەکان
لە گەورەکان سڵ دەکەن.. و
تۆ لە من  و منیش  لەتۆ و
هەردووک لەعیشق  وبەختەوەری   وساتەکان
درەختەکانیش  لەسێبەری یەکتر





ئاگر نەرم ونیانە
ئەو ساتانەی  با تورەی نەکات
ئاسمان  بە هەمیشەیی  ساماڵە
گەر تاریکی  و
بارگە بە ئستێرەکان نەپێچێتەوە
من  لە سروەی ڕۆحی
شەماڵێکی شەکەتەوە
بە جریوەی چۆلەکەیەک و
بەگۆرانی کوکوختیەک
نهێنی کۆچی باڵندەکانم دەرک کرد
لەسروری با تێناگەم
دەمێ بەڕومدا  پێدەکەنێ و
لەڕازی دڵی تاریکی
کە ڕووم  لێگرژ  دەکاتەوە
گەلێ جاریش
خەمی ئەو ساتە وەختانە دامدەگرێت
جۆلانەکانی خەیاڵم
سوک سوک  خۆیان رادەژەنن.. و
نازانم ، منداڵێکی بێ لانکیان لە ئامێز نێم
یا بیانکەم  بەژوانی بیرەوەری
نیشتیمانێکی دڵ ڕەنجاو

بەكۆڵانەكانی بەختەوەریدا تێدەپەڕم
ڕێكەوت نیگاكانم دەبات بۆ
سەر ئەو شەقامانەی
بەهەڵە یاساكانی بوونی تێدا دارێژراوە
تاكو ئێستاش نەمبینیوە
رایەخێ بۆ وەنەوزی جووتێ چاوی ماندوو
خۆی ڕابخات
یاخود زەمەن تاوێ
لەهاواری خۆی بكەوێ
تا هێمنی بۆ گوێی وجود بەرپابكا
ئیدی چۆن سات بەم نەمامی خەمەوە
ئارامی خۆی لەدەست نەدات ..
كوێ بگەڕێین
یەكسانی دابەش بوون دەبینینەوە ..؟
شەو دەنوێت و
چرایەكی بێدار لەوێ ئێشكگرە
كەمۆتەكە دەس دەنێتە بەرۆكی شاخەونەكانەوە
پەرییەک
بەبەر ماڵی خەونەكانیا تێدەپەڕێ
تێدەفكرێ ..
دەستەكانی



پێڵەكان بیرەوە دەچێت بمخوێنەوە

دەرگایەكیان بۆ ناكوترێ
زەمەن لەودیوی منەوە
هەر ساتەو بەڕەنگێک
تابلۆكانم دەنەخشێنێ
نیگارێكم بۆ دەكێشێ
لەهیچدا یەک ناگرینەوە.. و
بۆنی رۆحی یەكترمان
لێ نایەت

## زەمەنێکە ڕەنگەکانم کاڵ دەبنەوە

ڕووبارێک بێرەدا دەڕوات و
دەریایەک ڕادەبورێ
ئاور لەسینگی شەقار بردووی
بیابان نادەنەوە ..
کانیلەیەک لەسەر ڕێگامدا
هەڵدەقولێ
هێمنی ناخم دەشڵەقێ و
پەنجەکانم شەرم دەکەن
روخسارمی تێدا بشۆن و
تەویڵم فێنک کەنەوە
وشک هەڵدێم
دەڵێی وەرزی پێش بارانم





دەچمە نێو پێخەفی خەوو
بەبێداری دەڵێم :
شەو شاد
مۆڵەتی زاکیرەم بدە
تاوێک بەهێمنی بنوێ و
چەند چرکەیەک
بۆ تارمایی روحی شەکەتم بگەڕێت
ئەز دڵنیام
لەتۆدا دەبینێتەوە
ئیدی نەگرمەی هەورە بروسکە
نەگۆرانی کو کوختیەک.. و
نەسەدای شەوێکی بێدار
چرپەیەک
ناچپێنێتە گوێی وجود
ڕەشماڵێک لەدەردی ،
خێڵەکێتی من وشەوو ڕۆژ بێئاگا
قەفەزێک ،
لەئاوازی غەمگینی گەروی کەناریەک
تێدەفکرێ
ئەسەف لەڕیتمێکی ناگا..!!
کەزەمەن چاوم تێدەبرێ

تابلۆکانم دەشێوێن و
ڕەنگەکانم کاڵ دەبنەوە
ئیدی لەچاوی زەمەن و
سێبەری خۆم وەڕز دەبم
لاپەرەی ڕۆژ ژمێرێک و
روخسارم لەیەکدی جیا ناکەمەوە
ساتە وەختێک
تیشکیک لەو پەنجەرەیەوە
خۆی ئەکرد بەم هەوارەدا
ئەمرۆ لەدیدی دوێنێوە
پەردەی ژوورەکەم هەڵدەماڵم
وەلێ بوون ڕەش دەچێتەوە
من نازانم
شوشەی پەنجەرەکەم سیاهە..؟
یا نیگام تەڵخ دەروانێ ..؟
یاخود ڕۆژگار بەخەمۆکی
هاتۆتە جێژوانم ..؟
من و زەمەن
کە لەئامێزی یەکدی دەنوین
کاتژمێرێک لەنێوانماندا ڕادەکشێت و
جاڕی ئاوابونی خەونەکانمان دەدات





وێنەی پەپولەیەکی باڵ شکاوم
بۆ دەکێشێت
هەڵاژاوە بەسەر گوڵێکی سورەوە
باسی کەناریەکم بۆ دەکات
لەکەناری ڕوبارێکدالەتینوا خنکا و
شەپۆل لەسەمای خۆی نەکەوت
پۆرترێتی ..رۆحی شەوم دێنێتە یاد
لەدڵیدا ئەستێرەو مانگ ڕادەکشێنێ و
روخساریان قەترانی دەکاو
پێژێ کێ لەمن جوانترە
ڕەزێکم پێدەناسێنێ
بەسوێراوک ئاوی دەدەن
کانیەکم پیشان دەدات
ئەو مرواریانەی کەلەسنگیدا هەڵدەقوڵێن
لە دەستمدا دەبنە خۆڵ و
بەسەرجەستەی خاکدا دەرژێن
ناوی ئاوێکم پێناڵێت ..
جێی ماسیەکی شەکەتی تێدا بێتەوە
باسی چنارێکم بۆ دەکات
بەهار دێت ڕوت دەبێتەوە و
گەڵاکانی وەک پەرچەمم هەڵدەوەرێ

نیگەرانی کەخۆی بەناخما هەڵدەسوێت
جەستەم پروشە هەڵدەدات
ئیدی نەرازێک بێزی دێ لەگەڵما بدوێ
نەهاودەمێکم دەوێرێ
دەرگای دڵیم بۆ بکاتەوە..
کات دەروات و من دەشڵەژێم
بەشوێن کۆچرەوی باڵندەکان دەکەوم
بەجریوەی پاساریەکان دەزانم دێیت
ئیدی نەتۆ ئاقاری چۆڵی
ئەم ڕوحەت پێ ئاوەدان دەکرێتەوە
نەمنیش چرکەساتێک
لەکۆشی زەمەن دەسرەوم





## ئەوساتانەی
## بۆ سێبەری خەیاڵت دەگەرام

سەرەرێیەو جوانیەکان
بێرەدا دێن بۆم دەڕوانن
کۆترەکان
بەسەر دوا لقی سنەوبەرێکەوە
نیشتونەوەو حەپەساون
کۆترەکانیش ئەودەمەی
سێبەری جوانی بەلایاندا تێپەڕ دەبێ و
ووشەی خۆشبەختی دەبیستن
وەک من دەگرین
دەگرین بۆئەو چۆلەکانەی
ئەوپەیڤەیان لا نامۆیە
خۆشبەختی

نەرمە پەنجەکانی
کەدەرگای داخراوی دڵم دەکوتێت
گەرمەدەستەکانی
کەدەستی ڕچیوم دەگوشێت
جوانە نیگاکانی
ئەوەدەمەی لەسیمای پایزیم دەڕوانێت
وەلێ زۆر جارانیش
خەندەکانم دەکات بەخۆراکی گومان و
لەخۆڕا بەرسیلەی تەمەنی
ئەوینم دەوەرێت
ئێوارە ئەو چرکە ساتەی
چایی خۆشە لەنێو ئەم نەمامگەیەدا
نیگەرانی هۆشم دەبات
وەک زەمەنێکی شڵەژاو
گوڵێک نیە بیدەم لەیەخەی باخچەکەم
هاورێکەم لێم دەپرسێت :
کام گوڵ جوانە بۆنێوگوڵدانی ژورەکەم ؟
گوڵێک بەژنی چون خەم زراڤ
تەمەنی وەک عەشق درێژ
دەتۆش هاورێ
ناوی گوڵێکم پێ بڵێ هەڵنەوەرێت





ئالێرەشدا
من بۆنی گوڵم لێنایە و
لەنهێنی وەهمی ئەم باڵانە ناگەم
کوێوەم دەبەن و
بیرم دەچێت
کەسەرکەوتم دابەزینی بەدوادا دێت!
ڕۆژێک ویستم لەخەیاڵی
ئێوارەکاندا بتسرمەوە
سروشت بۆنی عەتری هەناسەی تۆی گرتوو
شەقامەکان بەدوی سێبەری خەیاڵت گەڕام
نەمدەزانی
لەچاوەڕوانی تۆیە
یان گۆدۆیە
شەورۆژ وساتەکانم
بەبێداری دەسپێرم
ئیدی تەمەن بەشی شتێکی تر ناکات
لەقوتبی سەهۆڵبەندانەوە هاتم و
ڕێم هەڵە کرد
لەنێوان خاک وئاسماندا ڕامام و
ئیستێکم کرد
کەخۆر نوێژی خۆشەویستی بۆدابەستم

من دەمزانی ڕۆژێک دادێت
بەتاسەی هەناسەی گەرمی
دەتوێمەوە و
دەڵێم جەخار لەو قەدەرەی وایلێکردم
لەپۆلی حەوا وئادەم بم
.







## لەمینای دڵتا مەمنێژە
## ئیدی گوڵە مینا ناگرم

لەمینای دڵتا بمنێژە
هەردەم گوڵە مینا دەگرم
لەدەریای مەنگی ناختدا
مەلەوانێکی شارەزام
یەک یەک وێسگە ئاویەکان
دەپشکنم
ئاشنادەبم بەوماسیانەی
مرواری ڕۆحی بێگەردیان
دەدەن لەزوڵف وپەرچەمم
ئەوماسیانەی
بەخەندەی گریاناوی من وەڕەس نابن ،
پێئەکەنن بەویستی دارستان نیە
کام وەرز درەخت گەڵا دەکاو
چ وەرزێک گوڵ دەپشکوێ وکەی دەوەرێت

بەویستی باخەوان نییە
گەر دارهەنار
ترێ یاخود بەهێ بگرێت
بەویستی لاولاو خۆی نیە
تەرزی بەکام دیواردکا هەڵزنێ
خۆ بەویستی منیش نیە
زەمەن لەکام پەنجەرەوە
خۆزگەکانی ناخم ببا و
لەدڵی سپێدەیەکدا
شاخەونێکم بتۆرێنێت
تاپێڵوەکانم لێک نەنێم
ئەستەمە چاوانت بنوێ ..و
وەنەوز میوانداریان کات ..
لەمینای دڵتا مەمنێژە
ئیدی گوڵە مینا ناگرم
نەخەم لەئامێزم دەگرێت
نەلەدڵی گەورەی هیچ دەریایەکدا
جێم دەبێتەوە
سەرنجی بێهودەیم دە
تاکوێم دەبا و
لەکوێدا دەمگێرێتەوە





لەمینای دڵتا مەمنێژە
چیدی گوڵە مینا ناگرم
بیکاتشۆ
کەتۆم جێهێشت
دەرگای بیستنم داخستو
پەیقینیشم دوماهی هات
بەدەستێکم
تەناففەکانی ئەوینم دەهۆندەوە و
دەستەکەی دیم
دیوارەکانی موحیبەتی دەڕوخان
چاوێکم بانگی دەکردی وبۆت دەگریاو
چاوەکەی دیم دەتیرەنجان
کەپەیقێکم لەناوەڕاستا دولەت بوو
لەتی یەکەم
باسی سێو و شەرابی عەشقی بۆت دەکرد
ئەوی دیان
دۆزەخێکی لەناختدا بەرپا دەکرد
لەنێو دڵتا ئاگرێکی دادەگیرسان
ئەز دەزانم
خۆشم نازانم چیم دەوێت
تێرامانە

لەنێوانی مردن و ژیندا
رەنگە تۆوی ئەو گوڵە بێت
کەزەمەنێک بێ ویستی خۆم
لەنەستمی چاند
سەردەمێک تۆم نەدەناسی
نەمدەزانی
عیشق چۆن لەدایک دەبێت و
کەینێ دەمرێت
بۆچی بەرگی ئاسودەیی لەبەر دەکا و
بۆ دەگریەت
رێکەوت رۆژێک لەگەڵ ئاوێنەکەم ئەدوام و
بوم بەتۆ
تەرزەکانی هزرم قرتاند
شادەماری دڵم پچران
هەر ون نەبویت
دواپەنجەرەی خەیاڵم بەڕوتا داخست و
کەچی رێگات بەخۆت نەدا
تاوێک لەبیرم دەربچی
ئیدی بۆخەم نەمخواتەوە
نیگەرانی تاپۆم نەکات
گەرتائێستا بیکاتشۆ لەناخما دەژی





# تۆش وەکو خەم بۆنی عیشقی منت لێدێ

گەڵاکانی تەمەن بگرە
بەدەم باوە هەڵدەوەرێن
کە مەرگ لەپەنجەرەکانی ئەودیومانەوە
دەروانێت و رادەبورێت
شەرم دەمگرێت تاوێک لەگەڵ ژیان بدوێم
ئێمە دەنوین تا شاخەونەکانمان نەمرێت
نیوە شەوێک چوون یاسەمەن
دەرژێینە نێو گوڵدانەکانی تەمەن و ئێنجانەکانی
خەیاڵمەوە
بێئوقرەیی گەمە بە ئارامیم دەکات
دورە پەرێز دەروانمە ئاهەنگی کۆتایی ساڵ... و
لەدایک بوونی ساڵی نوێ

هەمو ساڵێک ئەم دەمانە
گەمەم بە شادی و
پێکەنینم بەگریان و
گریانم بە پێکەنین دێ
دەسا نیکۆلاس لێم گەڕێ
دورگەی دوری چاوەکانم بەئەشک بشۆم
لەتەنهایی ژورەکەمدا
دوا قاوەی کۆتایی ساڵێکی دی ئەم تەمەنە بابردووە
بخۆمەوە
کوێوە بڕۆم خەم شوێن پێیەکانم هەڵناگرێت
ئەو دەمانەشی کەدەفڕم خەمی سربونی باڵەکانم
لەکۆڵدایە
شەوان لەتاریکی خۆمدا
دەستم دەنێمە نێو دەستی تێڕامان و
بەناخی شەقامەکان شۆڕ دەبمەوە
هەرچەندە ناخیان تەی دەکەم
ئارامیەک نادەن لەبەرۆکی ساتەکانی بێهودەیی
پێاسەی روحی نامۆم درێژە دەبات و
کوچەو کۆڵانێک نامێنی نەیپشکنم و
بەدوایی نهێنی چرکەکانی ئاسودەییدا نەگەڕێم
کۆڵانەکان دەمبەنەوە سەر یەک رێگا





شەقامەکانیش وەکو من لەگەڵ سروشتدا
دەجەنگێن
ناتەبایی خۆم و تۆ و سروشت و
رق و خۆشەویستیم بیردێتەوە
دەشێ پرسیارێک بێتە بوون
لەنیگاکانم ئاڵۆز تر
یاچی لوغزێک وەک گرێکانی دەروونم لێک
دەئاڵێت
مەودای نیوان شیرینی وتاڵی چی پێدەڵێن
با بەچاو بگرین وبەدەم پێبکەنین
چاویلکەیەک چاوەکانم دادەپۆشێت
زەردەخەنەو گریانم ئاوێتەی یەکدی دەکات
گشت دژەکان لەمندا کۆدەبێتەوە
سەیرکە هاورێ چەند جوانە بەدەم گریانەوە
پێبکەنێن و
ریتمێک بۆ ئازار دابنێین
کەتۆ هاتی شانە هەنگوینەکانی گێتیت بۆ بریم
تەرزی شادی وخەم و عیشق ونامۆیم لێک ئاڵاند
تامی شیرینیم لێ نەچەشت
پێکێکی تاڵت بۆ پر کردم
من دەیان راستی تاڵترم لەو پێکانەخواردۆتەوەو

سەرمەست نەبووم
گشت جەنگەکان لەمندا کۆ دەبێتەوە و
ئێوارە درەنگ وەختانێ ناخم  دەکات بەمەنزڵگا
شەڕی نێوان دەست وپەنجەکانم
شەڕی نێوان ئەبرۆ وبرژانگم
گشت دژەکان
لەتێکئاڵانی وەرزەکان و شەختەبەندانی زستاندا
لەئارامگای دەرونم دەحەسێنەوە
هاوڕێ تۆش چون خەمیت
لەهەرکوێ بیت بۆنی عەشقی منت لێدێ
دەرژێمە نێو خەیاڵتەوە ،
بەسێبەری پەنجەکانت تاڵ  تاڵ پرچم دائەهێنی
دەتۆش جارێک دەستەکانت بکەرە ملی خەونێکم
بەڵکو ساتێک زەمەن لەگەڵما نەجەنگێ و
لەگەڵ سروشتدا نەجەنگم



پێڵاوە بیرە دەچێت بمخوێنەوە

## خاک و خۆڵیش بۆنی هەناسەی بەفر دەگرن

لەسەر دێری
یەکەم شیعرەوە دێمەوە
نێو ڕەشنوسی بیرەوەریم
دەخزێمەوە
سوچێکی ئێوارەکانی بێدەنگیم
لەوێ ئەوان
تامەزرۆن بەبۆنی عیشق وبەختەوەری٠٠٠
ئەمێستاکە
خاک و خۆلیش ئاسودانە
بۆنی هەناسەی بەفر دەگرن٠٠٠
دوا شەو دەنوم

وەلێ لەکۆشی خەیاڵت نا
دەنوم بێئەوەی نیگات فێنکم کاتەوە و
هەناسەت باوەشێنم کا ...
ساتێک بەرلەوەی
شەرابەکانی تەمەنم
برژێتە ناو
جامە بەتاڵەکانی عومرەوە
بەخوێنی غەریبی من
شۆستەو شەقامەکانی شارەکەمی دەشۆرد
هێدی هێدی
بەبزەیەکی سادەوە
پەیقەکانی سەردەبریم و
وشەکانی لەتلەت دەکردم
بەرز دەفری
دەرۆشت تاکو گەڵای تەمەنم
لەودرەختە رەنگاڵانە بکاتەوە و
ئەستێرەی بەختم لەئاسماندا
جێ لەق بکات
منێک لەئاوێنەی
ئێوارە تەنهاکانی روحمەوە
لەروی ژاکاوی





سپێدەکانی عیشق دەروانم
پەنجەرە والاکراوەکانی مەرگ دەبینم
تنۆک تنۆک
دەرژێمە نێو خەراباتی عومرەوە
خۆ لەمێژەوە هەر دەڵێم
متمانە بەقەدەر ناکرێ
ژیان خەمێکە لەوە قورستر
شانیبەیتە بەر هاورێ
چیدی لێوە بار گرتوەکانم
بەماکیاژی رۆژەکان سورناکەم
نەبا دیسان
خونچە بگرێت وبوەرێت
نەلەشینایی چاوی دەریایەک
یاقوتەکانی ئۆقرەیی هەڵدەگۆزم
نەلە دڵی گەورەی
بیابانێکدا دەسوکنێم
لەناخی تاریکی شەودا
بیێرایەخ وپۆشاک دەنوم
منێک بەپاشماوەی غوباری
زەمەنێکی چر دەچم

نەنیگاکانم دەگەڕێنەوە بەر ڕۆشنایی تێروانین
ونەپەنجەکانم  دەدەن
لەدەرگای سپێدەیەک
نەقامەتم دەچێتەوە سەر
نەسلی ئەو چنارانەی
لەتاو عیشقی خواوەندێکدا
تاو تاو بەژنیان زراف  دەبێت





## مەوسیمەکانی عیشق

مەوسیمەکانی عیشق وابەسەردەچن
وەرەلەنێو دڵی گەورەی ئاودا
گەمەی ڕۆژانی
مناڵیمان دوبارە کەینەوە
دەمێک لێومان
بەلێوی پاراوی کانیاوێک
تەر دەکرد
گەروی وشکمان بەبێگەردی ئاو
تەڕی دەبوو
نەفامانە
بەردمان تورهەڵدەدایە
ئەو کانیاوەی
پێشتر لێمان دەخواردەوە
وەرە لەنێو دڵی بەردەڵان  وشەپۆلە تورەکاندا
دەوارێک هەڵدەین

ئاشنابین بەو ئاوازانەی
سەما بەماسیەکان دەکەن
چون ماسی بەعیشق تەربین
کەتاقە درەختێک نەمابێ
لەئامێزمان بگرێت
ئیدی بۆ روحمان بەمیهرەبانی ئاو نەسپێرین
ئێمە عاشقانە دەرۆین
مەستانەسەمادەکەین
من کەدەستی  شەپۆلەکان دەگرم
وامەزانن نوقمی تەنهاییم
هەردەم لەبێرەنگی ئاوو یەک رەنگی خوا
رادەمێنم
کەنەنکم  سوێندی پێدەخوارد
لەناخی تۆو سەرنجە شەرمنەکانت
ئەودەمانەی چاو دەبریتە
دەرگای رۆژگار
من نازانم کەینێ
بێدەنگیم دێتە دەنگ
ساتە کورتەکانی عومرو
گەمە شێتەکانی عیشق بەسەر دەچن
گوێچکەو زاری رازەکانمان کەڕولاڵن





نەدەدوێن نەدەبیستن
بۆ ئێمەی سوار
گەمەمان بەپیادەکان دێت
بەتۆ چی تەلارەکانی ئەوین
کەنەشئەیەک بەروح نادات
بێسودە پیاسەی کەنار ئاو
گەرنەتوانم بەسەر ئاودا هەنگاو بنێم
گەر هەمیشە بەیەک چاو بروانمە بوون
دووچاوم ناوێ بۆ روانین
باجامەکان پرکەین لەعیشق
کەنار ئاویش لەپەپولە
چەند جوانە سەمای پەپولە
دەمێ بەدواییدا هەڵدەفرم
بەرز دەفرێت ونایگەمێ
وەرە ئەو دورگانە تەیکەین
مرۆگەلێ نەیگەشتونێ
وەرە ئەو رەزانە ببرین
زەرردەواڵەیەک ناتوانێت
ژەهرەماچێکیان تێگرێت
دەستی ئەوچنارانە بگوشین

لەغوربەتدا دەروێن و
رێی نیشتیمان ناناسنەوە
تۆئەی ئەوکەسەی
قامەتت بەپێکهاتەی ناوم دەچێت
ئا لەوخەنەم رامەکەرەوە
لەتەمەنداجارێک دەیبینم
با زەرنەقوتەی ئەندێشەم
جیا لەمن بروانێتەبوون
بۆ مەحکوم بین هزرگامان
چوون یەکتر بێت





## غروری ژنێکی شوشەیی

زۆری نەمابوو
دواسرتەکانی تەمەن و
دواچرکەکانی هەناسەی
بسپێرێت بە
شەوە نوتەکەکانی بوون و
زەمەنە جەنجاڵەکانی من
ئەم پیاسانە
پیاسەی عاشقێک نییە مەستانە
لەدورگەکانی سەفادا خۆی وون بکات
غروری ژنێکی شوشەیی نییە
لەشەمەندەفەرەکەیدا پرچی خەیاڵی با ببیا و
بشنێتەوە
رەوتی دڵێکی نامۆیە
چاو برکێ لەگەڵ یەئس ئەکا
فرینی باڵندەیەکە
لەقەفەزە گەورەکانی بووندا

جێگای نابێتەوە
ئەی ئەو کەسەی
گەوهەرەکانی دونیای منت لێدەرژێ
پەنجەرەیەک لەپەپولە کوژراوەکانی دەرونم
بکەرەوە
وامدەزانی
بۆنی گوڵە مێخەکەکانی ئەوینمت گرتووە
هەینیەک چاو نابرێتە ئەو گوڵەهەنارانەی
ڕۆژان کۆیان دەکەمەوە
تاریکایی نوقمم دەکات
لەلیتاوی هەناسەی خۆی
سەیر چەن تەنیام
بەمەلە هەڵەتەکانی بەربارانی
غوربەت دەچم
گوێسەبانێک لەخۆم ناگرێ
زەمەن پرم دەکاتەوە لە
عیشق وتاریکی وناموێیی
کێ وەکو من
تامی هەنجیرە تاڵەکانی ئەوینی کردووە
چەند عاشقانە دەفرم و
باڵندانە سەمادەکەم





## ئەستێرەکان
## نارژێنە نێو دەستەکانم

شەو درەنگان
لەپیاسەی تەنهایی روح دەگەڕێمەوە
پیاسەیەک
بەرەنگی عیشق و
بەخەندەی وەریوم دەچێت
سەیرکە چەند پرم لەسۆز و
بەتاڵم لەبەختەوەری
نەشەو ئەستێرەکان
دەرژێنە نێو دەستەکانم
نەرۆژگار بەتریفە گەردانەی

پەلکە زێرینەم بۆ دەچنێ
پیاسەکانم لەناخیاندا
گوڵە غوربەتیان لێدەرژێ و
هەموو تەمەن دەگێڕنەوە
بۆ غوربەتستانێکی چڕ
چیدی بەرگەی گەمەی
وەرزەکان ناگرم
سەیرکە چەند پرم لەخورپە
بەخورپەی دڵی گوڵێک دەچم
بەبیانوی عیشق
دەستێک لە ژین دایدەماڵێ و
روح وجەستەی لەیەکدی جیا دەکاتەوە
زستان سەرم دەشوا و
بەتەری جێم دێڵێ
هاوین باوەشێنم ناکات
بەپەری وەنەوشەیەکی تەر
نەبەهار بەرسیلە دەکا و
نەپایزێک لەخەیاڵمدا گوڵ دەروێ
پێکەنینێکم نەبینی نەمداتەوە دەستی گریان
شارێک نییە پاش ئاشنابوون
نەمداتەوە دەستی غوربەت





زەمەن بەکاتم دەسپێریت
شەویش دەمبەخشێت بەرۆژکار
گوڵەکانی ناخم دەسوتێن
وەرزێک دەستەکانی بۆناکات بەسابات
خەم نەما نەمکا بەلانە
شەوێک نەما پەنجەکانم
لەپشتی بێداری نەسوێت
سپێدەیان دەمکەنەوە
بەئارامگای بێئارامی
سەیرکە چەند پرم لەسۆز و
چەند شەلاڵم
لەتێرامان وبێدەنگی
هەناسەشم
بۆنی غوربەتی گرتووە

## تۆپەڵەکان گەمەیان بە بێزاریم دێ

سپێدەیان روو لە سەوزایییەکانی
عیشقەوە دادەنیشتی
گوڵە ئەستێرەی ئەوینت بەسەردا دەڕژا
دەمە و مەغرییان لە پەنای
مێرگە وەنەوشەیییەکانی روحەوە
رادەبوردم
پۆلە پەپولەی خەیاڵت بە سەرپێڵوم
هەڵدەفرین و دەنیشتنەوە
گشت وەرزەکان ئیرەییان





بەگوڵی باخچە ئەفسوناویەکەی خەیاڵم دەبرد
سەیرکە
گەڵای درەختەکان
کە ژەنگ دەگرن
چەند ئەستەمە
لەگەڵ پایز ئاشت ببنەوە
درەنگ یا زوو
ئەستێرەکانی ئەم عومرە هەڵدێنەوە؟
شەقامەکان
بەرد دەگرنە پەنجەرەی
تەمەنی بێدەنگیم
شۆستەکانیش
وورده زیخیان لێدەوەرێ...
پەڵە پەڵە
هەورە بێگەردەکانم
دەسلەملانی تەمتومانکرد
تاوێک بەسەر درەختە عاشقەکانی بێشەکەمدا
میهرەبانی دانەباراند
لەنێو دڵی سپی ئەم بەفرە چڕەدا
تۆپەڵەکان
گەمەیان بە بێزاریم دێ

ئا لەودیوی شۆڕشەکانی خەمەوە
زەنگێک بە دەروازەی بیستنمدا
دێت و دەچێ...
نوقلّی ئەم جەژنە پیرۆزە
زاری تاڵمان شیرین ناکات
دارستانێکم نەبینی
لەشوباتدا
نینۆکی قین
رومەتەکانی نەڕنیبێ
لە سوچێکی دیوارەکانی بوونەوە
وێنەی ئەو عاشقانە دەگرم
هەرزەکارانە تێکدەڕژێن
لەو دەمەوەی بەهار و خاک
رەگیان لە دڵما داکوتا
خەونەکانم بەبێ کۆتا وەئاگادێ...
وەرە با دەس
لەنۆتەکانی ئازار و
لەسرودی گریان بەردەین
بەگۆرانییەکی غەمناک
چەپڵە بە دەستی لە رزۆکی
ئەم زەمەنە بدەینەوە





شەمەندەفەرەکان
بەفارگۆنی بەتاڵەوە
دێن ودەڕۆن
لەگەڵ ئەستێرەی تەمەندا
فریای سەفەرێک ناکەوم
دەشێت خەونەکانیشمان
وەکو سەفەری ئەم عومرە
یوتوبیابن
ئاخۆ کەینێ بە کۆچی باڵندە و
بەهەرەسی
چیا و بەرد ومرۆڤەوە
حیکمەتێکی نوێ
دێتە بوون
ئەمڕۆ لەگەڵ
دوایین هەناسەی بەفردا
جگەرەیەک دامدەگیرسێنێ و
چڕە دووکەڵی سووتانم
لە بەژنی درەختە
زرافەکان دەئاڵێنێ

# دوا نیگاکان لە وێسگەیەک لێکدا دەبڕێن

بەسیەتی گۆرانی تەنهایی
ئێمە دەمێ ئاسودە دەبین
بەیەک دڵ و یەک دەم و یەک دەنگ
پێیکەنین
ئەو ساتانەی  سەماکانمان
لە ئاهەنگی غەریبیماندا ساز دەکەین
دڵنیابین
ماسیە تینوەکان
لە لێوی شەپولە تورەکاندا
تینوێتی روحیان دەشکێنن و





گەڵاکان لەگەڵ درەختەکانیاندا
ئاشت دەبنەوە
جەنگی سروشت و وەرزەکان
کۆتایی دێت
ئەو دەمانە ئاسودە دەبین
دور لە گەمەی بەرژەوەندیەکان
دەئاخفێن
وەرە
نیگاکانمان لێو رێژکەین
لە جوانی و عیشق و بێگەردی
ئاخر گوڵم
ئەو دەمانە عیشق خۆشە
لەمەوسیمی خۆیدا دەزە ئەکا
دوا لەحزەکانی تەمەن خۆشە
کەچی تەمەن کۆتایی دێ
ساتەوەختێک خەوشرینە
وەنەوز لە چاوان دەتورێت
بەخورپەن ئەو چرکانەی
بۆ بینینم دێت
لەوێ نیم
دێت لێت هەڵدێم

دێم تۆ دەڕۆیت
دوا نیگاکان لە یوتوبیای
نەهات و هاتدا
لە وێستگەیەک لێکدا دەبڕین.
ئەستێرەکان کە
چاو دەبڕنە چاوانم
لە شەوقی حوزنی نیگاکانما
دەکوژێنەوەو
سێبەری ئەم زوڵمەتە
چاوشارکێم لەگەڵدا دەکات
یەکەم جارە باخچەکەمان
وەرزێکی چون خۆی بناسێ
بۆنی گوڵە پرتەقاڵەکان
کۆڵانەکەمان مەست دەکا
درەنگە بۆ ئاشنابوونی
گوڵاڵە سورە
بە بەهار
درەنگ کەوتم بۆ هەڵمژینی
بۆنی گوڵە یاسەمەنەکانی عیشق
و بۆنی
بخوری هەناسەت..





